Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

حک... عیراق
بەڕێوەب... ەنییەکان



# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی چوارەمی بنەڕەتی



حکومە... عیراق
وەزارە...
بەڕێوە... چاپەمەنییەکان

Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings



# پەروەردەی ئیسلامی
# بۆ پۆلی
# چوارەمی بنەڕەتی

دانانی

فاروق محمد علي عباس
خواجة طه شاهين
عبد الجبار محمد شريف
حسن محمد شريف

پێداچوونەوەی زانستی

د.بشير خليل توفيق
ابو بكر علي كاروانى

وەرگێرانی
صادق عثمان عارف

چاپی دووەم
١٤٣٧ کۆچی ٢٧١٦ کوردی ٢٠١٦ زایینی

بەناوی خودای مەزن و دلۆڤان

## پێشەکی

سوپاس بۆخودای خاوەن هەمووشتێک، وەدرودو سڵاو لەسەر گەورەی نێردراوان، محمد و لەسەر کەسو کارو یاوەرەباشەکانی وئەوانەی دوای کەوتون تارۆژی پەسلان .

وەزارەتی پەروەردە لە هەرێمی کوردستانی عیراق دەرفەتێکی باشی رەخساند بۆ خزمەتکردنی رۆلەکانی لەنەوە سەربەرزەکان بە دانانی پەرتوکی نوێی پەروەردەی ئیسلامی بۆ قۆناغی بنەڕەتی.

پرۆگرامەکە کۆمەڵێک دەقی قورئانی و فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ) و هەندێک بابەتی باوەڕ و پەرستنی تێدایە وئەم بابەتانەمان پێشکەش کرد کەبەگوێرەی فەرموودەکانی پێغەمبەر بوو (د.خ) لەراڤەی فەرموودەو دەقەکاندا رەچاوی رونی و بەدیارخستنی شوێنەکانی مەزنیمان کردوە و بەستنەوەی ئەم رێنماییە بەرزانە بەژیانی راستەقینەی رۆژانەمان ئەمە هەندێک ئەرکمانە بەرانبەر نەوەکانمان . بەڵام مامۆستا بەرێزەکان ئەوان ئەرکی خۆیان باشتر دەزانن ولەسەر شوێنی بەرپرسیارەتیان داکۆکی زیاتر دەکەن . وەئەوان بروایان بەوەیەکە دەیڵێنەوە، بەشێوەیەکی بابەتی و زانستیانە وپشت ئەبەستێت بە رێگەی گفتوگۆ و وتووێژو چالاکی ئاسانی گونجاو لەگەڵ ژیانی قوتابیان .

هەروەهاپێویستە توندی بەکار نەهێنیت بەهەمووجۆرەکانیەوە بەرامبەر قوتابیان لەبەرئەوەی قوتابی لەم قۆناغەدا بوونەوەرێکی هەست ناسکە، وەئامانجمان ئەوەیە کە یەکەکانی ئەم پەرتوکە تێبگات بەشێوەیەکی باش و هەست بە بوونی و فێرکردن و گفتوگۆی دروستکەربکات، و وتووێژ بە رەوانی و ببێتە ئەندامێکی کاراو بەسوود بۆ خۆی و نیشتمان و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی و کۆمەڵگەی ئیسلامی بەشێوەیەکی تایبەتی .

سوپاسی هەرتێبینیەکی بەنرخ یان بیرۆکەی دروستکەر دەکەین کەلەپسپۆرو خاوەن پەیوەندیەکان بەدەستمان دەگات تاسوودی لێوەرگرین لەچاپەکانی داهاتووی ئەم پرۆگرامەدا .

ئاواتمان سەرکەوتنی هەموولایەکە

# چەند سیفەتێکی موسڵمان

موسڵمان / بڕوای بەبونی خودای گەورە هەیە، تەنیا ئەو بە بەدیهێنەری گشت بوونەوەر دەزانێت بە بینراو و نەبینراوەوە .

موسڵمان / بڕوای بەرۆژی دوایی و زیندو بوونەوەو لێپێچینەوەو بەهەشت و دۆزەخ، هەیە .

موسڵمان / گوێڕایەڵە بۆ دایک وباوکی، ڕێز لە مامۆستایانی دەگرێت، هاوکاری مرۆڤەکان دەکات .

موسڵمان / زمانی دەپارێزێت لەهەر وشەیەکی نامۆ و ناپەسەند .

موسڵمان / دەستی لەهەر ئازار گەیاندنێک دەپارێزێت .

موسڵمان / ڕاستوێژەو درۆناکات .

( قال الرسول(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خودا (د.خ) فەرمویەتی :
(اتق الله حيثما كنت واتبعِ السيئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلقٍ حسن).
واتە: ( لەهەر بارو دۆخێکدا بویت لەخودا بترسە، بەدوای هەڵەدا دەستبەجێ چاکە بکەو ڕەفتارت لەگەڵ مرۆڤەکان خۆش و باشبێت ) .



چالاکی:

بخوێنەوەو پاشان بنوسە:

خۆشەویستی خەڵک لەڕەوشت و ئاکاری منە.

— — — — — — — — — — —

— — — — — — — — — — —

— — — — — — — — — — —

بۆشاییەکانی خوارەوە بەوشەی گونجاو پڕبکەرەوە :

١- موسڵمان بڕوای وایە خودای پەروەردگار ـــــ .

٢- موسڵمان ــــــ، ــــــ ناکات .

٣- موسڵمان ــــــ لەئازار گەیاندن دەپارێزێت .

٤- ــــ ی دایک وباوکی دەکات و ڕێز لە ــــ دەگرێت و هاوکاری ــــ دەکات .

لەهەر بۆشاییەکدا وشەی (چاک ) یان (خراپ) بە پێی گونجان بنوسە:

١- ڕاستبێژی کارێکی ــــ و درۆزنیش کارێکی ــــ .

٢- ئازاردانی خەڵک کارێکی ــــ و پاراستنی نهێنی هاوڕێ کارێکی ــــ .

٣- گوێڕایەڵی دایک و باوک کارێکی ــــ و یاخی بوون لێیان کارێکی ــــ ە .

٤- ئازاردانی گیانلەبەر کارێکی ــــ و بەزەیی پێهاتنەوەی کاری ــــ ە .

٥- دزی و فرِوفێڵ لەکارە ــــ و دڵسۆزی لەکارە ــــ ەکانە .

نـــزا :

خودایە .... تالەژیانداین چاکمان بۆ بکەی و دوای مردنیش بێ بەشمان مەکە لێی، لەسزای ئاگریش بمانپارێزە.



# لەناوە پیرۆزەکانی خودا

(( الرحمن، الملک، القدوس، السلام، العدل )).

هەریەک لەم ناوانە واتاو چەمکی خۆی هەیە و هەمووشیان پیرۆزو جوانن .

الرحمن / بەواتای رەحمەت، ئەو بەخششە یە بەندە کانی خودا لەدونیادا شایستەی دەبن و گشتگیرە بۆ هەمووان وەک یەک .

الملک/ خاوەنی موڵک ودەسەڵات . هەموو بوونەوەرەکان تەنها خودا خاوەنیانە .

القدوس / خاوێن و دوور لە هەموو ناشرین ووەسفێک شایستەی بێگەردی ئەونەبێت.

السلام / ئاشتی بەخشە و دوورە لە ناتەواوی و نەنگی .

خودا دەفەرمووێت: هوَ الله الذي لا إله إلا هو المَلكُ القدوسُ السلام..*

العدل/ بێ هاوتایە لە دادوەری

**چالاکی:**

بخوێنەوە و پاشان بنوسە.

هو الرحمن الرحيم، الملك، القدوس، السلام.

- - - - - - - - - .

.- - - - - - - - -

. — - — — - -

ئەوناوە پیرۆزانەی خودای گەورە، بڵێ کەدەیان زانیت .

چەند بوارێکی بەزەیی و سۆزی خودا بۆ بەندەکانی، بژمێرە .

*ئایەتی :٢٣ (الحشر).

# باشترین هاوڕێ

دڵدار قوتابییەکی دڵنەرم و خاوەن هەستە، مرۆڤەکانی دەورو بەری خۆشدەوێت و کامەرانییان بۆ دەخوازێت. هەر هاوڕێیەکی ناساغ بێت یان پێویستی بە یارمەتی هەبێت بەپیریەوە دەچێت و هاوکاری دەکات .

جارێک بۆلای هاوڕێیەکی دەچوو، بەگەنجێکی ناسیاوی گەیشت، لێی پرسی بۆ کوێ دەچیت ؟

دڵدار : سەردانی هاوڕێیەکم دەکەم .

گەنجەکە : دیارە بەرژەوەندیەک لە نێوانتاندا هەیە ؟

دڵدار : نەخێر .

گەنجەکە : ئەی قەرزت لای هەیە ؟

دڵدار : نەخێر، قەرزیشم لای نیە .

گەنجەکە : کەواتە هۆی سەردانەکەت چیە !

دڵدار : مەرج نیە تەنها بەرژەوەندی تایبەت مرۆڤەکان پێکەوە ببەستێت، بەڵکو هاوڕێیەتی لای من لەوە پیرۆزترە، من هاوڕێیەکەم زۆر خۆشدەوێت و رێز لەنێوانماندا هەیە، ئاینەکەشمان ئاڕاستەمان دەکات سەردانی هاوڕێ بکەین و لەتەندروستی بپرسین.لەم روەوە پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: ((خیر الأصحاب عند الله خیرهم لصاحبه)).

واتە، لای خودا، باشترین هاوڕێ ئەوکەسەیە زۆربەتەنگ هاوڕێوە بێت .

گەنجەکە، گوتی : ئافەرین، تۆ کوڕێکی میهرەبانی، خوداش، لەسەر ئەم هەستە بەرزەت پاداشتت دەداتەوە .



چالاکی:

بۆشاییەکان پڕبکەوە:

دڵدار کوڕێکی ـــــ بوو، خەڵکی خۆشدەویست و سەردانی ـــ دەکردو هیوای ـــ بۆدەخواستن .

گفتوگۆ:

١- پەیوەندی نێوان هاوڕێیان، دەبێت چۆن بێت ؟

٢- هاوڕێی خراپ کێیە ؟

٣- هەندێ سیفات و ئاکاری جوانی هاوڕێکەت بڵێ .

نیشانەی (ڕاست) یان (هەڵە) بۆ هەر بڕگەیەک دابنێ:

١- هاوڕێی بەوەفا هاوکاری کەسانی دیکە دەکات.

٢- بەرژەوەندی تایبەت دەکرێتە پێوەر بۆ هاوڕێیەتی.

٣- پێویستە لە هاوەڵی خراپ بەدوور بین .

٤- دەبێت لەهەڵەی هاوڕێ ببورین .

٥- هاوڕێ لە تەنگانەدا دەردەکەوێت.




چالاکی:

بخوێنەوە و پاشان بەجوانی بینوسەوە:

خودایە ... لەدایک و باوکم ڕازی بە، بەختەوەریان بکە .

ـــــــــــــــــ .

ـــــــــــــــــ .

ـــــــــــــــــ .

نزا

پەروەردگار .... ئەم وڵاتەمان بۆ ئاوەدان و ئارام کەیت و لەبەڵا و زیان بیپارێزە .

# باوەڕ بەخودا

لەکاتێکدا داکیان باسی بونەوەرو دروستکراوانی خودای بۆ منداڵەکانی دەکرد، کەچۆن هەمووی بەیاسا ڕێکخراوەو هەربەشێک کاری خۆی دەکات و هەمووشی لەخزمەتی ئێمەی مرۆڤدایە .

لەپڕ یەکێک لەمنداڵە بچوکەکان، گوتی: دایەگیان، ئایا دەتوانین خواببینین ؟ دایکە وەڵامی دایەوە : نا، کچی شیرینم . خوا ئێمەدەبینێت، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەو ببینین . لەرێی دروستکراوەکانی و تواناو دەسەڵاتیەوە دەیناسین .

منداڵ : هیچ شتێک شێوەی خوای تیایە ؟

دایکی : نەخێر، هەرگیز . خوا بەدیهێنەرە، جگە لەو هەموو شتێک بەدیهێنراوە، بەمنو تۆو گشت مرۆڤەکان، گیانەوەران و رووەک و دروستکراوانی تریشەوە .

(لیسَ کمثلهِ شیءٌ وهو السمیعُ البصیر).*

واتە : هیچ شتێک لەخواناچێت و تەنها ئەوە بیسەرو بینەری هەموان .



* الشوری ١١.

چالاکی:

بۆشاییەکان پڕبکەرەوە:

١- (خودا) ــــ هەمووشتێکە .

٢- موسڵمان تەنها ــــــ دەپەرستێت .

٣- خودای گەورە ــــــ لەهەموو جێیەک .

بینوسەوە:

خودای گەورە بوونی هەیە لەهەموو جێیەک .

ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ

. ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ

. ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ

نزا

پەروەردگار ...... دڵ ودەرونم گوشادو کارم ئاسانکە.



# باوەڕ بە پێغەمبەران و نێردراوانی خودا

مامۆستا / قوتابیانی ئازیز : بڕواپێبون و خۆشەویستی پێغەمبەرانی خودا لەسەرمان پێویست کراوە .

لەو پێغەمبەرانەش : موسی، عیسی، پێغەمبەرمان محمد (سەلامی خوای لێبێت ) .

دوانێردراویش بۆمرۆڤایەتی (محمد ) ی پێغەمبەرمانە (د.خ) وەک لەقۆناغە رابوردوەکانی خوێندندا فێربوون.

هەریەک لەئێمە دەزانێت کەپەڕتوکی رەوانەکراو لەلایەن خوداوە بۆ سەر پێغەمبەرمان (د.خ) قورئانە .

ئایەدەزانن هەردوو پەڕتوکی موسی وعیسی، ناویان چیە ؟

احمد : بەڵێ مامۆستا تەورات ئەو پەڕتوکە هاتەخوارەوە بۆموسی (سەلامی خودای لێبێت ).

سارة : پەڕتوکی گەورەشمان (عیسی ) ناوی ئینجیلە .

مامۆستا : ئایا پێغەمبەرانی دیکەش هەن، جگەلەو زانایانەی ناومان هێنان ؟

سیزار : بەڵێ، مامۆستا، پێغەمبەرانی دیکەش هەبوون .

مامۆستا : ئافەرین، دیارە لەمێژووی پێغەمبەران شارەزایتان هەیە . بشزانن لەو پێغەمبەرانە ناوی تەنها ٢٥ کەسیان لەقورئاندا هاتوە .

چالاکی:

ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

١- خودای گەورە و بێگەرد خۆشەویستی پێغەمبەرانی لەسەر ـــــ پێویست کردووە .

٢- ـــــ دوا پێغەمبەرە.

٣- خودای گەورە ـــــــ ناردۆتەخوارەوە بۆ پێغەمبەرمان محمد (د.خ) وە پەرتوکی ـــــــ بۆگەورەمان موسی ـــــــ بۆگەورەمان عیسی (سەلامی خوایان لێبێت).

گفتوگۆ:

١- ژمارەی ئەو پێغەمبەرانەی ناویان لەقورئاندا هاتوە، چەندە ؟

٢- ناوی هەندێک لەو پێغەمبەرانە بنووسە کە لەقورئاندا ناویان هاتووە .

نزا

(پەروەردگار ..... لەگەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان، لەبەهەشتدا کۆمان بکەرەوە).



# فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە

فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپە یەکێکە لەپایەکانی کۆمەڵگەی پتەوو دروست، ئەمەش ئاینەکان بانگەشەی بۆ دەکەن . ئاینی ئیسلام بایەخێکی شیاوی بەم بوارە داوە، وەک لەقورئانی پیرۆز دا هاتوە:

((ولتَكُنْ منكم امةٌ يدعون الى الخير ويَأمُرونَ بالمعروفِ ويَنهونَ عن المُنكَرِ وأولئِك همُ المُفلحون)).*

خودای گەورە بەشێوەی فەرمان، پابەندی بەم پایەوە ڕاگەیاندوە .

هەر کۆمەڵگەیەک ئەندامەکانی پابەندی فەرمانی خودا نەبن، بارودۆخیان تێکدەچێت و گەندەڵی دەبێتە سیمایان و پشێوی دەیانگرێتەوە . کۆمەڵگەیەکیش فەرمان بە چاکەو ڕێگری لەخراپە بکەنە بنەمای ئاکاریان ئاسودە دەبن و لەسایەی خێرو خۆشی و ئارامیدا دەبن .

گفتوگۆ:

١- ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

لەپایەکانی کۆمەڵگەی پتەوو بەختەوەر ـــــ یەو ـــــ یش بایەخی زۆری پێداوە .

هەروەها ـــــ تریش بانگەشەیان بۆ کردوە .

٢- پێنج لەکردەوە باشەکان بژمێرە .

٣- پێنج کردەوەی ناپەسەند بڵێ .

بینوسەوە:

(( كُنتُمْ خيرَ أُمّةٍ أُخْرِجَت للنّاس تأمرون بالمعروفِ وتَنهَونَ عنِ المُنكَر ))

- - - - ـــ - - - - -

- - - - ـــ ـــ - - - -

- - ـــ - - - - ـــ -

نزا

پەروەردگار ...... لەبیرچون وهەڵەکانمان لێ مەگرە و بمانبەخشە .

* ال عمران ـ ١٠٤

# ( فەتح ) رزگار کردنی مـــەکـکە

مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی سەبارەت رزگارکردنی مەککە بەقوتابیەکانی گوت :

مەککەی پیرۆز، ئەوشارەیە کە پێغەمبەرمان محمد (د.خ) تیایدا لەدایک بوو لەژێردەسەڵاتی قورەیشیە بێباوەڕەکاندا بوو کە زۆر ئازاری پەیڕەوانی ئاینی ئیسلامیان دەدا، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە . ئەمەش بوە هۆی کۆچکردنی موسڵمانان بۆ (یثرب) شاری (المدینة المنورة)، پاشان سەرلەنوێ لەلایەن پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەساڵی ٨ ی کۆچیدا مەککە رزگار کراو پاککرایەوە لەچەپەڵی بێباوەڕان،بەو بۆنەیەش خودای گەورە سورەتی (النصر)ی نارده خوارەوە بۆ محمد (د.خ) وفەرمانی پێکرد سوپاسی بکات لەسەر بەخششی رزگار بوونی مەککەو سەرکەوتنی هێزی باوەڕ بەسەر بێباوەڕیدا . لێرەدا، نیگار لەمامۆستای پرسی : ئایا دانیشتوانی مەککە باوەڕیان بەو ئاینە نوێیە هێنا کە (ئیسلام )بوو ؟

مامۆستا : بەڵێ، نەک هەرئەوان،بەڵکو بەکۆمەڵ لەگشت هۆزو تیرەکانەوەو لەهەموولایەکەوە خەڵکی رویان دەکردە مەککە بۆراگەیاندنی پەیوەندیان بە ئاینی ئیسلامەوە کە بە رووداوێکی مێژوویی هەرەگرنگیان دەزانی .

بسم الله الرحمن الرحيم

[إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّه وَالْفَتْحُ(١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّه أَفْوَاجاً(٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً(٣)].

گفتوگۆ :

ناوی سورەتەکەبڵێ - بۆ چی ئەو ناوەی بۆ دانرا ؟

دوای رزگار کردنی مککة، خودای گەورە چ فەرمانێکی بە پێغەمبەر (د.خ) کرد ؟

کەی خودای پەروەردگار کۆمەکی بەندەکانی دەکات لەکارەکانیاندا ؟

ئەم رستانەی خوارەوە تەواو بکە:

زۆرێک لە ـــــ دەهاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە .

پێغەمبەرمان محمد دەیفەرموو : سوپاس بۆ خودا لەسەر ـــــ .

سورەتی ـــــ لە بۆنەی رزگارکردنی مەککەدا هاتەخوارەوە .

مەککة ئەو شارە بوو کە ـــــ ی تیا لەدایک بوو .

نزا

پەروەردگار .... بەسەر دوژمناندا سەرمانخە .



# سورەتی (قریش)

سوارە لای باوکی دانیشتبو کەقورئانی دەخوێند، کاتێک گەیشتە (رحلة الشتاء و الصیف) لەسورەتی (قریش) ، لەباوکی پرسی : واتای ئەو دەستەواژەیە چیە ؟

باوکی گوتی : تیرەی قورەیشی کەسوکاری پێغەمبەر (د.خ) لەزستاندا بەرەو خاکی (الیمن) و لەهاویندا بۆ (الشام) دەرۆیشتن بەمەبەستی بازرگانی . لەچوون و گەڕانەوەدا کەس رێی لێ نە دەگرتن، ئەو ئارامیەش بەخششێکی خودابوو . لەخاکی خۆشیان دا هیچ ترسیان لەکەس نەبوو، سامانیان پارێزراو بوو، ئایا دەزانی خودای گەورە لەبەرانبەردا داوای چی لێکردن ؟

سوارە : بابەگیان بۆم باس بکە، دڵم لای قسەکانە .

باوکی : **داوای دووکاری لێکردن:**

١- سوپاسی بکەن لەسەر بەخششەکان بۆ ئەوەی بۆیان زیاتر بکات.

٢- تەنها خودا بپەرستن، خودای (الکعبة) کە تەنهاو بێ هاوەڵە، ئەمەش لەسورەتی قورەیشدا، کە دەفەرمووێت :

بسم الله الرحمن الرحیم

[لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ(١) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ(٢) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ(٣) الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ(٤)].

گفتوگۆ:

١- خودای گەورە کام بەخششی بەخشیبو بە قورەیشیەکان ؟

٢- مرۆڤ، لە سەر چی سوپاسی خودا دەکات ؟

تەواوی بکە:

تیرەی ــــ سەرقاڵی بازرگانی بوون بۆ (الشام) لە وەرزی ــــ داو بۆ (الیمن)لەوەرزی ــــ .

بینوسەوە :

خودایە .....ئەم وڵاتەمان ئاسودەو ئارام بکە .

ــ ــ ــ ــ ــ ــ ــ .

ــ ــ ــ ــ ــ ــ ــ .

ــ ــ ــ ــ ــ ــ ــ .

نزا

خودایە .....لەسەر یادکردن و سوپاسگوزاری و باش پەرستنت، کۆمەکمان بکە .



# سورەتی (الماعون)

منداڵە بچوکەکان دەوری داپیرەیان دابوو بۆ گوێگرتن لەئامۆژگاریەکانی، سەبارەت تێرکردنی هەژاران ، و مامەڵەی جوان لەگەڵ بێ باوکان و کاری چاکە و بەجێهێنانی نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا .

یەکێک لە منداڵەکان پێی داگرت لەسەر باسی بێ باوکان، بۆیە نەنکی زیاتر روونی کردەوە و پێی گوتن : پێغەمبەرمان محمد (د.خ) بێ باوک گەورەبوو، ئەوە دیاردەیەکی ئاساییە، بەڵام پێویستە بەچاکی و میهرەبانی رەفتار لەگەڵ بێ باوک و دایکدا بکەین . وەک خودای گەورە لەسورەتی (الماعون ) دا دەفەرموێت :

بسم الله الرحمن الرحيم

[أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّين(١) فذلِكَ الَّذِي يَدُعُّ اليَتِيمَ(٢) ولايَحُضُّ عَلى طَعَامِ المِسْكِين(٣) فَوَيْلٌ لِلمُصَلينَ(٤) الذينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ(٥) الذِينَ هُمْ يُراءُونَ(٦) ويمنعون المَاعُون(٧).

گفتوگۆ:

ئـ ـ ١- ناوی سورەتەکەچیە ؟

٢- هەتیو کێیە؟ پێویستە چۆن بین لەگەڵی؟

٣- ئەرکی سەرشانی موسڵمان بەرانبەر هەژارو بێنەوایان چیە ؟

٤- سەرەنجامی کەسێک رێگری لەکاری چاکە بکات، چیە؟

ب ـ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەیەک لە وشەکانی نێو کەوانەکان پڕبکەوە:

(رۆژی دوایی، گەردن کەچدەکات، بێباوەڕ، چاکە دەکات ) .

١- موسڵمان لەنوێژدا ــــــ بۆ خودا .

٢- موسڵمان باوەڕی بە ــــــ هەیە.

٣- ــــــــ رۆژی دوایی بەدرۆ دەزانێت .

٤- موسڵمان تەنها لەرێی خودادا کاری ــــــــــ.

نزا

بڵێ خودایە ......... زانستم زیادکە.





ئاو سەرچاوەی ژیانە دەستگرتن بە بەکارهێنانی
ئەرکێکی ئایینی و نیشتمانییە .

# ئیسلام ئاینی بەزەییە
# بەسەرهاتی سەگێکی تینوو

لەسەردەمێکی کۆندا پیاوێک کەزۆر حەزی لەگەشت بوو، رۆژێک لەماڵ چوە دەرەوە بەرەو جێیەکی دوور . لە رێگەدا ئاوی لێ بڕابوو، تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، زۆر ئەملاو ئەولای کرد بۆدۆزینەوەی سەرچاوەیەکی ئاو، لەپڕ بیرە ئاوێکی بەدیکرد .

چوە ناویەوە، دابەزی تا دەستی بەئاو گەیشت و تێری لێ خواردەوە، کاتێک هاتە سەرەوە بینی سەگێکی تینو خۆڵ دەلێسێتەوە تابەهۆی شێداری خۆڵەکەوە کەمێک لەتینوێتی بشکێ . ئەم دیمەنە پیاوەکەی دڵگران کرد، چونکە دەیزانی تینوێتی زۆر سەختە، بڕیاری دا یارمەتی ئەو گیانەوەرە بدات، بۆیە دابەزیەوە بۆ قوڵایی بیرەکە و بەتاکێ پێڵاوی خۆی ئاوی بۆ دەردەهێنا، تاتێرئاو بوو . بەم کارە جوانەی کەوتەبەر سۆزو رەحمەت ولێخۆشبوونی خودای میهرەبان .



**پەند لەم بەسەرهاتە:**

١- دەبێت مرۆڤی موسڵمان بەسۆزو بەزەیی بێت لەگەڵ خەڵک و گیانەوەرانی دیکەش .

٢- هەردەم سوپاسگوزاری خودابێت لەسەر بەخششەکانی کە ناژمێردرێن .

٣- کردەوەی باش باکەم وسادەش بێت، پاداشتی گەورە و چونە بەهەشتی لێدەکەوێتەوە.

پێغەمبەرمان محمد (د.خ) فەرموویەتی: (من نَفَّسَ عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة). واتە : هەرکەسێک بتوانێت باوەڕدارێک لەتەنگانەیەکی ژیانی دونیا رزگار بکات، خودای پەروەردگار لە کۆسپێکی رۆژی دوایی رزگاری دەکات .

گفتوگۆ :

١- ئەگەر مرۆڤێک یان گیانەوەرێکی دیکە لە تەنگانەدابوو، ئێمە دەبێت چی بکەین بەرانبەری ؟

٢- ئایا ئەو پیاوەی ئاوی دا بەسەگەکە پاداشتی خێری لەخوداوە دەست کەوت ؟

٣- چەند نمونەیەکی سادە لەسەر سۆزو بەزەیی بەخەڵک و گیانەوەرانی دیکەدا بێنەرەوە .

بەم وشانەی خوارەوە بۆشاییەکان پڕبکەرەوە:

(( کردەوەی باش، نەرم ونیانی، میهرەبان، کرداری بەد، سۆزو بەزەیی )).

١- موسڵمان هەمیشە_____ لەگەڵ کەسانی دیکەدا .

٢- خودا مرۆڤی خۆشدەوێت _____ ئەنجام بدات و ئەوانەی خۆشناوێت _____ ئەنجام دەدەن.

٣- ئاینی ئیسلام خوازیاری ____ یە لەگەڵ ئاژەڵاندا .

٤- پێغەمبەری خودا (د.خ) نمونەی پێشەوایی بوو لە_____ دا.

بـیـنـوسـەوە:

(( میهرەبان بن لەگەڵ ئەوانەی لەسەر زەویدان،

ئەوەی لەئاسماندایە بە بەزەیی دەبێت لەگەڵتان )).



# کورتەیەک لەژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (د.خ)

پێغەمبەرمان محمد (د.خ) لەساڵی (الفیل) لەشاری مەککەی پیرۆز لەدایک بوە . خۆشەویستمان (د.خ) بەهەتیوی گەورەبوو، چونکە (عبدالله)ی کوڕی عبدالمطلب کەباوکی بوو، پێشهاتنە دونیای محمد مردبوو، پاشان دایکیشی (امنة)ی کچی وهب کۆچی دوایی کرد، کە هێشتا تەمەنی (٦) ساڵان بوو.

پاش ئەوە (عبدالمطلب) ی باپیری سەرپەرشتی کرد، کەتەمەنی گەیشتە (٨) ساڵی ئەویش کۆچی دوایی کرد، مامی کەناوی ابوطالب بوو (محمد) ی بردە لای خۆی گەورەی کرد. لەوماوەیەدا شوانی دەکردو هاوکاری کەس وکاری دەکرد لەکارەکاندا، مامیشی لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆبازرگانی، لەبەر راستگۆیی ودەستپاکی و رەفتاری جوان نازناوی (الصادق الامین)ی هەڵگرت لەگەنجیەوە کەتەمەنیشی گەیشتە ٤٠ساڵ، سروشی لەئاسمانەوە بۆهات و پەیامی ئیسلامی لەخودای جیهانیانەوە پێگەیشت و بوە پێغەمبەر (د.خ) .

سەرەتای پەیامی خودایی بۆ محمد (د.خ) بەئایەتی:

**(اقرأ باسم ربكَ الذي خلق....)** وەک یەکەم ئایەتی قورئان،لە (سورەتی العلق ) دەستی پێکرد . ئەم ئایەتە بوە دەسپێکی بانگەواز بۆ ئاینی نوێی (الأسلام ) و ئەرکی ئەو کارە مەزنە کەوتە سەرشانی محمد (د.خ) . یەکەم کەسیش کەبڕوای بەپەیامی نوێ هێنا، لە پیاوان (ابوبکر الصدیق) بوو کەهاوەڵی پێغەمبەر بوو .لەنێو ژنانیشدا هاوسەری بەرێزی خۆی (خدیجة الکبری)و لەنێو مێرد منداڵانیشدا ( علي کوڕی ابي طالب ) ی ئامۆزای بوو، (خوالێیان رازی بێت) .

## گفتوگۆ :

١- پێغەمبەر (د.خ) لەکوێ لەدایک بوو ؟
٢- پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، محمد نازناوی چی هەڵگرتبو؟
٣- ئەو پیشەو کارانەی لەژیاندا کردویەتی کامانەبوون ؟
٤- یەکەم ئایەتی قورئان کەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرمان (د.خ) چی بوو ؟
٥- کێ بوون ئەوانەی یەکەم جار باوەڕیان بەپەیامی(الاسلام) هێنا لەپیاوان وژنان میردمنداڵ ؟

## ئەم بۆ شاییانەی خوارەوە پڕبکەرەوە:

١- باوکی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) کە ناوی ـــــ بوو پێش لەدایکبوونی مرد.
٢- دایکیشی کەناوی ـــــ بوو دوای ـــــ ساڵی تەمەنی محمد کۆچی دوایی کرد .
٣- ـــــ ی باپیری سەرپەرشتی دەکرد دوای مردنی دایکی محمد.
٤- تەمەنی پێغەمبەر ـــــ ساڵان بوو کە یەکەم جار قورئانی بۆ هاتە خوارەوە .
٥- یەکەم کەس لەپیاوان باوەڕی بەپێغەمبەر هێنا ـــــ بوو، لەژنانیشدا ـــــ و یەکەم لاویش ـــــ بوو.



# لەڕەوشتەبەرزەکانی پێغەمبەرمان محمد (د.خ)

گرنگترین پایە لەپێکهاتەی کەسایەتی پێغەمبەرمان (د.خ) ڕەوشتە بەرزەکانیەتی کە هاوشێوەی نیە، ئەمەش بەشایەتی خودای گەورە لەقورئاندا بەئایەتی: ((وانك لعلى خلقٍ عظيم) (*) لە سورەتی (القلم).

ژیانی پیرۆزی پێشەوامان پڕە لەوێستگەی ڕەوشت بەرزی، لەوانەش، خۆبەکەم زانین لەبەر خودای گەورە، وەک بڕیارنەدانی شوێنی تایبەت بۆ دانیشتن، نوستنی سەر بەڕەو حەسیر، خۆراکی سادە وەک هەژارانی ئوممەت، هەرچی لەبەر دەست بوایە ئەوی دەخوارد، هاوکاری خێزانەکانی لەکاری ناومالّداو خزمەتی ئەوانەیان ناساغ بوونایە . هەروەها سڵاوکردن لەهەموو کەس تەنانەت منداڵانیش گەر بەلایاندا گوزەری بکردایە . زۆر بەسۆزبوو بۆ منداڵی ساواو بەسنگیەوە دەگرت . لەمانەو گشت ئاکارە بەرزەکاندا پێشەنگ بوو بۆ هاوەڵان و گشت موسڵمانان .

گفتوگۆ:

١- ئەوئایەتەی قورئان بڵێ کە وەسفی ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر (د.خ) دەکات .

٢- ئاماژە بۆ چەند بوارێکی خۆ بەزل نەزانین لە پێغەمبەرمان دا بکە.

(*) سورەتی (القلم)- ئایەتی ٤

بۆشاییەکانی خوارەوە بەوشەی گونجاو پڕبکەرەوە:

پێغەمبەری ئازیزمان (د.خ) لەسەر ـــــ دادەنیشت و ـــــ خێزانەکانی دەکرد لەکاری ناومالْدا. بەسۆزبوو بۆ ـــــ و بەسنگیەوە دەگرت، گەربەلای منداڵاندا گوزەری بکردایە ـــــ لێدەکردن .

نزا:

پەروەردگار .....هەروەک سیماو روخسار و شێوەمت باش رێکخستووە،هەرواش رەوشتم بەرزوباش بکە .

بینوسەوە:

((وانك لعلى خلق عظيم)).

ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ .

ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ .

ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ .

ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ .



# سەرەنجامی درۆکردن

رۆژێک (هیوا) و چەند هاورێیەکی پێکەوە چوون بۆ سەر رووبارەکەی نزیک گوندەکەیان بەمەبەستی مەلەکردن، دوای ئەوەی (هیوا) چووە ناو ئاوەکەوەو لێیان دورکەوتەوە، لەپڕ هاواری کرد : رزگارم کەن .... رزگارم کەن.... واخنکام.

هاورێکانی بەپەلە بە پیریەوە رۆیشتن، دوانیان خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکەوە، کەگەیشتنە لای، سەری دەرهێناو بەگاڵتە پێکردنەوە گوتی :درۆم لەگەڵ کردن . ئەم رەفتارەی هاورێکانی سەرسام کرد . دوای چەند رۆژێک جارێکی دیکە بەهەمان شێوە ئەم دیمەنە دووبارە بۆوە، بەڵام ئەم جارەیان (هیوا) کەوتە ژێر ئاو تادەم و لووتی ئاوی تێچوو . هەرچەند هاواری کردو دەستی دەرهێنا، هاورێکانی بەدرۆیان زانی و برِوایان پێی نەبوو متمانەیان بەقسەکانی نەکرد، بۆیە بەپیریەوە نەچوون، نەک وەکو جاری پێشویان لەگەڵدا بکات .

بەڵام پیاوێک کە لە کەناری رووبارەکەدا نزیکی وەستابوو چوە پێشەوە بەهانایەوە چوو، رزگاری کرد و پاش هەناسە پێدان و یارمەتیدانی هۆشی بە بەرداهاتەوە . بینی هاورێکانی لەدەوری وەستاون بۆیە بەشەرمەوە، گوتی : داوای لێبوردنتان لێدەکەم، هەڵەی خۆم بوو، وانەیەک فێربووم هەرگیز لەبیری ناکەم .



چالاكی:

بەم وشانەی خوارەوە بۆشاییەكان پڕ بكەرەوە:

(درۆكردن، راستگۆیی، درۆزن، قەدەغەیە، رزگاربوون).

١- ـــــــ خاوەنەكەی دەبات بۆ بەهەشت و ـــــ دەیبات بەرەو دۆزەخ.

٢- ـــــــ لەراستگۆیی دایە.

٣- درۆكردن لەئیسلامدا ـــــــ.

٤- متمانە بە ـــــــ ناكرێت.

گفتوگۆ:

١- هۆی چی بوو هاوڕێكانی (هیوا) بڕوایان بەقسەكانی نەكرد لەجاری دووەمدا؟

٢- كێ بوو (هیوا)ی لەخنكان رزگاركرد ؟

٣- دواجار (هیوا) چ بەڵێنێكی دا بەهاوڕێكانی ؟

نزا

لا إله الا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين.

خودایە .... جگە لە تۆ خودای دیكە نییە، پاك و بێگەردی هەر بۆتۆیە، من ستەمم لەخۆم كردوە .

# جێنشینە راشیدەکان

دوای کۆچی پێغەمبەر (د.خ) کاروباری موسڵمانان سپێردرا بەجێنشینە راشیدەکان کەئەمانەن :

١- جێنشینی یەکەم : ابو (بكر) ی الصديق (خوای لێ رازی بێت ).
٢- جێنشینی دووەم : (عمر)ی کوری الخطاب ( خ . ز ).
٣- جێنشینی سێیەم : (عثمان)ی کوڕی عفان ( خ . ز ).
٤- جێنشینی چوارەم : علي کوڕی ابي طالب ( خ . ز ).

ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەر ( د.خ) بەو ریزبەندەی سەرەوە کرانە جێنشینی پێغەمبەر، بۆ بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایی موسڵمانان . خزمەتی ئاین و هاووڵاتیانیان دەکرد، نمونەی هەرەبەرزی دڵسۆزی و هاوکاری و خۆشەویستی بوون بۆ پێغەمبەر و ئاینی ئیسلام . لەفەرمانڕەوایی داد پەروەرانە دەجوڵانەوە، بۆیە ئەرکی سەرشانمانە خۆشمانبوێن .

چالاکی :

نیشانەی (راست) یان (هەڵە) بۆ هەر رستەیەک دابنێ :

١- جێنشینە راشیدەکان ژمارەیان (٥) کەسە .
٢- دوای کۆچی پێغەمبەر (د.خ) جێنشینە راشیدەکان کاروباری موسڵمانانیان گرتەدەست .
٣- خۆشەویستی جێنشینە راشیدەکان لەسەر موسڵمانان پێویست نیە .
٤- جێنشینە راشیدەکان بەرگرییان لە ئیسلام دەکرد.

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕبکەرەوە:

جێنشینی یەکەم (ـــــــ) بوو دووەمیش (ـــــــ) و سێیەم جێنشین (ـــــــ) و جێنشینی چوارەمیش (ـــــــ) بوو.

بینوسەوە :

جێنشینە راشیدەکان هاوەڵانی پێغەمبەر بوون و کرانە جێنشینی.

. ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ

. ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ

. ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ



## ناوەڕۆک